بِسْـــمِ اﷲاِلرَّحْمَنِ الرَّحِيم

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

ڕوونکردنەوەی بابەتێک سەبارەت بە | نیکاح و زەواجی بێ وەلی ئەمر |

واتە زەواجێک کە وەلی ئەمری ئافرەتەکە بوونی نەبێت، ئافرەتێک بەبێ وەلی ئەمر عەقدی نیکاح ببەستێوو زەواج بکات.

گومانی تێدانیە هەرکەسێک "حەدیث" بخوێنێتەوە وە هەروەها شارەزای ئەثەربێت تێیدا هاتووە و واریدبووە کە "نیکاح بەبێ وەلی باطلە" خۆ ئەگەر شاهیدیش بوونی نەبێت ئەوە بەڕاستی زینایەکە بە نەفسی خۆی، وە بەئاشکرا لەلای سەلەف وەکو دێینە سەریوو بەیانی دەکەین.

پێچەوانەی أهلی ڕەئی لە [الأحناف والرافضة] ئەوانەی کە ئیجازەیانداوە بە ئافرەت، تەنانەت بۆ ئەوەی هاوسەرگیری بکات "بەبێ وەلی وە بەبێ شهود" لێرەشەوە بابێکی گەورەیانکردووەتەوە بۆ زینا و بۆ خراپەکاری و بۆ زەواجێک کە هیچ ئەساسێکی نیە لە شەرعدا، وەکو پێشتریش بابیان کردەوە بۆ کوفر و بۆ دۆزینەوەی فێڵ لەم بابەتەدا،

وەکو ئەوەی کە ڕێگایانداوە ئافرەت کە خاوەنی مێردبێت ئەتوانێت مورتەدبێتەوە کافربێت هەڵگەڕێتەوە لە ئیسلام هەتاوەکو ئەو عەقدەی لەگەڵ ئەو پیاوەی کە هەیەتی هەڵبوەشێتەوە ئەگەر وویستی زەواج لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بکات یاخود وویستی جیابوونەوەی لەو پیاوە هەبێت، تەنانەت ڕێگەیانداوە کافربێت بەخاتری ئەوەی ئەو عەقدە هەڵبووەشێتەوە، ئەوکاتەی کە عەقدەکە هەڵوەشایەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، وەکو لە کتابەکانیاندا نەصیان هەیە دەربارەی وە شانازی پێوە دەکەن وە بەشانازییەوە باسی دەکەن بەیانی دەکەن ئەم فێڵە ناشرینە.

بۆیە سەلەف لەم بابەیا زۆر توندبوون، وە ئەوانەیان بە گومڕازانیووە کە خەریکی ئەم جۆرە کارانەن، کە زەواج و عەقدی نیکاح دەبەستن بەبێ بوونی وەلی ئەمر بەبێ بونی شاهید، وە تەبەڕای خۆیانکردووە لەوانە و لە مەزهەبیان وە ئاگاداریان دەربارەیانداوە، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆش لە هەندێک وڵاتی عەرەبی و غەیری عەرەبیشدا بڵاو بووەتەوە، زۆربەی وڵاتان کە لای خۆشمانیگرتووەتەوە بەڕاستی کۆمەڵێک ئا لەم فیرەقە ئاڕائییە پیسانە لە ژێر پەردەی قانون و تەنانەت لە ژێر پەردەی دینیشدا زەواجیان ڕێگاپێداوە بەبێ وەلی ئەمری ئافرەتەکە حەتا بەبێ شاهید ئەو ئافرەتە خۆی دەتوانێت بچێت لە مەحکەمە یان لە هەرشوێنێکی دیکە یان مەلایەک کە خەریکی فرۆشتنی دینە بیهێنێت و زەواجەکەی بۆ حەڵاڵبکات، ئافرەت خۆی دەچێت بۆلای قازی لەگەڵ هاوڕێیەکیدا خۆی خۆی عەقدی خۆی دەکات، واتە خۆی خۆی دەدا بە شوو بەبێ وەلی ئەمر بەبێ شاهید حەتا نەک ئەوەی کە ئیزنی وەلی

ئەمرەکەی لەسەرنیە تەنانەت زۆرجار هەرئاگاشی لێینییە، بۆیە ئا ئەم فیرەقە تاوانبارە خراپەکارە بڵاوەیانکردووە بەداخەوە لە زۆر لە شار و وڵاتدا لە کۆن و لە ئێستاشدا تەنانەت هاوسەر هاوسەری خۆی نەناسیووە تەنها ئەوکاتە نەبێت کە چووەتەلای هێندە بێ ئاگابوون لەیەک، بەداخێکی زۆریشەوە بەهۆی کرانەوەی دوونیا لە ڕێگای قەناواتە فەزایەکانەوە لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە کرانەوەیەکی ئێجگار گەورە ڕوویداوە بۆیە لیبراڵیەکان هەروەها عەلمانیەکان وە بێچوەکانیشیان کە گەوەرەکەیان ئەورووپایە کە ڕێگەیانداوە بە ئافرەت زەواج بکەن بەبێ شهود بە بێ ولی ئەمر، وە بەحەق و مافی ئافرەتی ئەزانن، بۆیە لێرەوە دەرگایەکی گەورەیان کردووەتەوە بۆ فیتنە، ئەوانەی لای خۆشمان لەژێر پەردەی دیندا تەقلیدی ئەوانیانکردووەتەوە لایانداوە لەو هەموو نەصە وازح و ڕوونەی دەربارەی [وەلی ئەمر] هاتووە وە ئەو ئەقوالانەی سەلەف دەربارەی وە صحابە دەربارەی [شاهید] هاتووە کە پێوویستە وەلی ئەمر هەبێت ڕەزامەندی لەسەربدات وە شاهید ئامادەبێت، بەڵام لەهەموو ئەمانە لایانداوە شوێن لیبراڵی و عەلمانی و ئەورووپایەک کەوتون کە هیچ بەهایەکی ئەخلاقی و ئینسانی تێدانەماوە بەڕاستی، بۆیە هەمیشە ئەوانەی لەلای خۆمان لەژێرپەردەی دیندا خەریکی ئەم کارانەنن، بەشووێن زەلەو هەڵەی عالمێکدا دەگەڕێن، بەشووێن شتێکی شاز و نامۆدا دەگەڕێن تاوەکو ئەو زەندەقەی خۆیان بشەرعێنن وە ئیدیعا و بانگەوازی بۆ بکەن بەناوی عیلم و زانستەوە، بەڵام حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە دێینەسەری و باسی ئەکەین کەهیچ پەیووەندیەکی بە [دینی ئیسلامەوە نیە ئەم کارانە]

بەڵکو تەنها لاساییکردنەوەی باپیرەگەورەیانە کە بریتیە لەو دیمکراسی و عەلمانیەت و ئەورووپایەیی کە بەرهەمەکەی ئەوتا بەچاوی خۆمان دەیبینین و ئەو هەموو فەسادیەی بڵاوبووەتەوە چەندەها نەخۆشی کوشندە و پیس ، بە هۆی ڕووداوگەل کارگەلێکی ئا لەو جۆرەوە.

جا بەئیزنی الله تعالی ئەو نەصانە ڕوون دەکەینەوە باسی ئەکەین سەبارەت بە [باطل بوونی وە ناجائیز بوونی نیکاحێک کە وەلی ئەمری ئافرەتەکە ئیزن و ئاگاداری لەسەر نەبووبێت]، لەم بابەتەیا حەدیثێکی مەشهورمان هەیە کە حەدیث ێکی صحیحە ، رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (لا نِكَاحَ إلاَ بولي).

واتە : **نیکاح بوونی نیە ئیلا بەوەلی ئەمری ئافرەتەکە نەبێت، و اتە دەبێت وەلی ئەمری ئافرەتەکە ڕەزامەندبێت وە ئاگاداربێت وە ڕەزامەندی لەسەربدات.** حەدیثەکە (أبو داود، الترمذي الدارمي، امام أحمد، الطيالسي، ابن ماجَة، ابن الجارود له [المُنتَقى]، أبو يعلى، ابن حبان، الدارقطني، الحاكم، البيهقي، ابن حزم له [المحلى]، الخطيب له [تاريخ بغدادا]، البغوي له شەرحی [السنة]) لەدا لە ڕێگای ابن اسحاقە وە لە باوکی بردة وە، لە باوکی موسی وە، لە باوکیە وە بە مرفوعی، وە جەماعەتێک لە اهلی حەدیث صحیحیان کردووە وەکو (ابن المديني، احمد، وبن معين، الترمذي، ابو داود، الدارقطني) جگە لەوانیش بۆیە ئەمە بەسە لەوەی کە حوجە بێت بەسەر غەیری ئەوانەوە کە خیلافیانکردووە لە تصحیح

كردنى له حەدیث ەكه، زیاتر له (٣٠) هاوەڵ ئەم حەدیث یان ڕیووایەتكردووه كه [الحاكم في مستدركه]یدا ڕێگاكانى بەیانكردووه و ڕوونیكردووەتەوه، [الترمذي به تلخصى] هێناویەتى له البابى (عائیشەوه ـ رضى الله عنها ـ له ابن عباس ەوه له أبي هريرة له عمران ى كوڕى حصين وه له أنس ەوه ، پاشان دەفەرمووێت : [وَالعَمَلُ في هَذَا البَابِ عَلَى حَديثِ النَّبِيِّ ﷺ] كاركردن لەم بابەتەدا بریتیه لەو حەدیث ەى رسول الله ﷺ كه دەفەرمووێت : [لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ] له لاى اهلى علم له هاوەڵانى رسول الله ﷺ. لەوانه (**عمرى كوڕى خطاب، علي كوڕى أبي طالب، عبدالله ى كوڕى عباس و اته ابن عباس، وه أبوهريرة**) وه جگه لەوانیش، وه هەروەها ڕیووایەت كراوه له هەندێك له فقەهاى تابعين ەوه كه فەرموویانه [لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ] نیكاح بوونى نيه بەبێ وەلی، لەوانه (**سعيد ى كوڕى المُسَيب، الحسن البصري، شُرَيح، ابراهيم النخعي ، عمرى كوڕى عبدالعزيز**) وه جگه لەوانیش، وه ئا بەم قەوولەش وتويانه لەوانه (**سفيان الثوري، الأوزاعي، عبدالله بن المُبارك، مالك، الشافعي، أحمد، إسحاق**). معمر له [جامعه] كەیدا هێناویەتى [به ژماره : ٢٣٩] وه الروياني له مسنده كەى [بەژماره : ٨٣] هەرچەند لەمەى كه ئەمان هێناویانه له سەنەدەكەیدا ضعف ێك كه هەیه له الحسن ئەویش له عمران ەوه كه رسول الله ﷺ ـ فەرموویەتى : [لا يَحِلُ نِكاحَ إلا بولي وَصداقِ وَشاهدَي عَدل]

وەهەندێك له عروات به مرسل ڕیووایەتیانكرده، ئەفەرمووێت : **نیكاح بوونى نيه بەبێ وەلی ئافرەتەكه بەبێ مارەى وه بەبێ دوو شاهیدى عەدل.**

ئیمامی | أحمد | لە مسنَدە کەیدا [بە ژمارە: ٢٤٢٠٥] وە جگە لەویش لە | عائیشة | وە .رضی اللە عنها . ڕیووایەتیان کردووە فەرموویەتی : رسول اللە . ﷺ . فەرموویەتی : [إذَا نُكِحَتِ المَرأَةُ بِغَيرِ أمرِ مَولاَهَا] واتە : ئەگەر ئافرەتێک نیکاحی بەست زەواجی کرد بەبێ ئەمروو فەرمان و ڕەزامەندی وەلی ئەمرەکەی [فَنِكاحُهَا بَاطِلُ فَنكَاحُهَا بَاطِلُ فَنِكَاحُهَا بَاطِلُ] ئەوا نیکاحەکەی باطلە نیکاحەکەی باطلە وە نیکاحەکەی باطلە.

خۆ ئەگەر چووە لای [فَلَهَا مَهرُهَا] ئەوا مارەیەکەی ئەبات نیکاحەکەشی باطلە، حەدیث ەکە ڕاجیاوازی هەیە دەربارەی ئیمامی | أحمد | ضعیف یکردووە وەکو لە [مَسائل حرب] [بە ژمارە: ٤٦٣] هاتووە، هەندێک لەدوای ئەوان تەصحیحیان کردووە وەکو (ابن خزيمة، ابن حبان، البيهقي) تەساهولێکیان تێدا نواندووە، وە لە مانای ئەمەدا وەکو شاهیدێک هاتووە [لانكَاحَ إلا بولي وَشاهِدَي عَدلِ] کۆمەڵێک ئەحادیث ی مرفوعِ لە (علی یەوە، لە جابر لە ابي هريرة لە عمران لە ابن عباس لە ابن مسعود لە ابن عمر لە ابي مسى وە لە عبداللە کوڕی عمر ەوە لە المسوری کوڕی مَخرمَة وە لە أنس ی کوڕی مالك ەوە لە معاذی کوڕی جبل وە لە ابي ذر الغفاري ەوە لە المقداد ی کوڕی الأسود لە عائیشة وە وە لە أم سلمة وە لە زینب ی کچی جحش ) .رضی اللە عنهم اجمعين . زیادەیەک تێدا هاتوە [وشَاهِدَي عَدلِ] لە أساندیا قسە و قەول هەیە کە هیچ شتێکی تێدا جێگیر نەبووە واتە بوونی شاهید وەکو حەدیث باسی شاهیدی

کردبێت وەکو ئیمامی | أحمد | لە [الجامع العلوم] ئیمام احمد هاتوە لە موجەلەدی - ١٥ - (لا : ٥٢) ئەفەرمووێت : [لَم يَثبُت عن النبي ـ ﷺ ـ في الإشهاد على النِكاحِ شَيءُ، وقال مرة : لَيسَ فيه حديثُ صَحيح]

ئیمامی | أحمد | ئەفەرمووێت : لە رسول الله ـ وە ـ ﷺ . هیچ حەدیث یێکی صەحیح نەهاتووە کە دەربارەی شاهید بە مەرج گرتبێتی بۆ نیکاح.

ئەوەی کە جێگیربووە لە صحابەوە وە لە تابعینەوە لە سەلەفەوە لەم بابەدا کە ناکرێت ڕەتبکرێتەوە بە هیچ شتێک ئیلا کەسێک بیەوێت جەحد و ئینکاری بکات و بە هەوای خۆی ئەم ئەثەرانە وەرنەگرێ. هێندە ئەثەرەکان زۆرن لەسەلەفەوە لەم بابەتەدا کەبەڕاستی وەکو هەورە تریشقە و هەورە برووسکەیەک وایە بۆ اهلی ڕەئی و وە بۆ اهلی هەوا و وە ئەوانەی کە شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوون لایانداوە لە حەدیث لە ئاثاری صحابە و لە سەلەف و لە تابعین دووای ئەوانیش و ەڕوونی ئەکاتەوە کە نیکاح کردن بەبێ وەلی وە بەبێ شاهید نیکاحێکی باطلە بەڵکو سزا و جەڵدی ئەو کەسانەشیان کردووە کە ئەم کارەیان کردووە وەکو دێینەسەری و ڕوونی دەکەینەوە بە ئیزنی الله تعالی.

|البیهقي| لە السنن الصغیر [بە ژمارە:٢٣٨٣] لە عمرەوە ـ ضي الله عنه ـ دەفەرمووێت : [لاَ نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ وَشاهِدَي عَدلِ] واتە : **نیكاح بوونی نیە ئیلا بە ڕەزامەندی و ئامادەبوون و ئاگاداربوونی وەلی ئافرەتەكە و وە دوو شاهید نەبێت.**

|عبد الرزاق | لە المصنف [بە ژمارە: ١٠٤٨٥] لە ابن ابي شيبة [بە ژمارە: ١٥٩٢١] لە مصنف هێناویانە، عمری كوڕی خطاب ـ رضی الله عنه ـ دەفەرمووێت : [رَدَّ نِكَاحَ إمرأَةِ نَكَحَت بِغَيرِ إِذنِ وَلِيِّهَا] **عمری كوڕی خطاب ـ رضی الله عنه ـ نیكاحێكی هەڵوەشاندەوە كە ئافرەتێک بەبێ ئیزنی وەلی یەكەی ئەو نیكاحەی كردبو.**

چونكە باطلە بەبێ ئیزنی وەلی، واتە بەبێ بوونی وەلی ئافرەتەكە.

|سعید بن منصور| لە سننە كەیدا [بە ژمارە: ٥٣٧] لە ابراهیم كوڕی محمد ی كوڕی طلحة وە ئەفەرمووێت : عمری كوڕی خطاب فەرموویەتی : [لَا يُزَوَّجُ النِّسَاءَ إِلَّا الأَولِيَاءُ]

واتە : **ئافرەت نادرێت بە شو ئیلا وەلی یەكەی نەبێت ئەدات بە شوو.**

[لَا تُنكِحُوهُنَّ إِلَّا مِنَ الأَكفَاءِ] كەواتە بەبێ بوونی وەلی ئافرەتەكە نیكاحەكەی باطلە، ئەبێت وەلی ئافرەتەكە ئافرەتەكە بدا بە شوو.

هەروەها |سعيد بن منصور| لە سننه ـەکەیدا [بەژمارە: ٥٣٠] وە |عبد الرزاق| لە مصنەف ـەکەیدا لە عکرمة ی کوڕی خالد ەوە فەرموویەتی : **[ئافرەتێک زەواجی بۆ ڕێکخرا (عەقدی نیکاح) (یاخود درا بەشوو بەکوردی بیڵێین) بەبێ ئەوەی کە وەلی یەکەی ئاگاداربێت، گەیشتەوە بە ئیمامی عمر. رضی الله عنه . ئەو کەسەی کە نیکاحەکەی کردووە ئەوەشی ڕێکی خستووە هەردووکیانی جڵد کردووە نیکاحەکەشی هەڵوەشاندەو ]**.

|البیهقي | لە الكبرا يا لە علی یەوە ئەفەرمووێت : [لَا نِكاحَ إِلَّا بِوَلِيَّ]

واتە : **نیکاح بوونی نیە ئیلا بەوەلی نەبێت**، وەلی ئەمری ئافرەتەکە.

[وَلَا نِكاحَ بِشُهُودِ ِ] واتە : **نیکاح بوونی نیە ئیلا بە شاهید نەبێت.**

ئیمامی | أحمد بن حنبل | صحیحی کردووە وەکو لە (مَسائلِ حرب) هاتووە | البیهق | خۆشی لەدووای تەخریجەکەی بە صحیحی داناوە.

|عبدالرزاق | لە مصنف هێناویەتی لە ئیمامی علی وە فەرموویەتی : [لَا نِكاحَ إِلَّا بِوَلِي يَأْذَنُ]

واتە : **نیکاح بوونی نیە ئیلا بەبێ ئەوەی وەلی ـەکە ئیزنی بدات**، بەبێ ئیزنی وەلی ئافرەتەکە نیکاح بوونی نیە و باطلە.

|ابنُ أبي شيبة| لە مصنف [بە ژمارە: ١٥٩٢٢] لە الشعبي ـەوە دەفەرمووێت : [مَا كَانَ أَحَدٌ مِن أَصحَابِ النبي ـ ﷺ]

واتە : هیچ یەکێک لە هەواڵانی رسول الله ـ ﷺ ـ نەبووە [أَشَدَّ فِي النَكَاحِ بِغَيرِ وَلِيَ] کە زۆر توندبێت لە نیکاحێکدا کە بەبێ وەلی ئەو نیکاحە بەسترابێت ئەو عەقدە بەسترابێت [مِن عَلِي حَتى كَانَ يَضرِبُ فيه] هیچ یەکێک لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ نەبووە هێندەی ئیمامی |علی| ـ رضی الله عنه ـ توندبووبێت لەم بابەتەدا کە نیکاحێک بەسرابێت بەبێ وەلی حەتاوەکو داویەتی لەو کەسەش ئەوکارەی ئەنجام داوە، وە جەڵدی تێدا بەکار هێناوە.

|عبد الرزاق| لە مصنف لە شعبي یەوە ئەفەرمووێت: [**عمر، علی، ابن مسعود، شريح**] ـ رضی الله جمعن ـ ئەڵێت فەرموویانە : [لَا يُجِيزُونَ النكاحَ إِلَّا بِوَلِي]

بە جائیزیان نەزانیووە نیکاح ئیلا بە وەلی نەبێت، واتە بە ئیزن و ڕەزامەندی وەلی ئافرەتەکە.

ئیمامی |شافعی| وەکو لە مسندە کەیدا |والبيهقى| لە سننە الكبيردا وە لە الصغير يشدا وە تەصحيحى يشى كردووە بە سەنەدێكى جيد لە ابن عباس ەوە.رضي الله عنهما . فەرموویەتی : [لَا نِكاحَ إلَّا بِولي مُرشِدِ ِ وَ شَاهِدي عَدل]

واتە : **نیکاح بوونی نیە ئیلا بە وەلی و دووشاهید نەبێت.**

ئەم ئەثەرەی ئیمامی | أحمد | صحیحی کردووە وەکو لە (مسائلِ حرب)دا هاتووە.

|عبد الرزاق| لە مصنف دا هاناویەتی لە ابن طاوس ەوە لە باوکیەوە فەرموویەتی : [فَرقٌ بَينَ النكَاحِ، وَالسَفاحِ الشُّهُودُ] واتە: جیاوازی نێوان نیکاح ێکی شەرعی و وە نیکاح ێک کە هیچ ئەساسیاتێکی شەرعی نەبێت بریتیە لە "شاهید" کە شاهید بوونی نەبوو ئەو نکاحە هیچ ئیعتبارێکی شەرعی نیە، کە شاهید بوونی هەبوو وە هەروەها وەلی یش بوونی هەبوو ئەوکاتە ئەو نیکاحە نیکاحێکی شەرعییە .

|عبدالرزاق | لە مصنف دا لە إبرهيم ەوە فەرموویەتی : دەربارەی زەواج بە شاهێدی ئافرەتان .

فەرموویەتی : [يُفَرقُ بَينَهُمَا] واتە : **جیادەکرێنەوە لە نێو انیاندا**، کەمترین شت [ خَاطِبٌ وَشَاهِدانِ] ئەبێت خاطیب ێک هەبێت وە دوو شاهیدیش هەبێت، واتە

پیاوێک کە خوازبێنی ئافرەتێک دەکات لەگەڵ دوو شاهید، تەبعەن لەگەڵ وەلی دا چونکە بەبێ وەلی نیکاحەکە باطلە وەک لە حەدیث ە صحیحەکەی کە باسمانکرد [لَانِكَاحَ إلا بِولي].

واتە : ئافرەت ناکرێت بەشاهید لەم بابەتەدا، ئەو دوو شاهیدە دەبێت "پیاو" بن کە لەم نیکاحەدا شاهید دەبن.

بەڵکو نیکاح بەبێ وەلی بە "زینا " هەژماریان کردووە سەلەف وە جەڵدیشیان کردووە وە نیکاحەکەشیان ڕەد کردووەتەوە.

|سعید ی کوڕی منصور| و |عبد الرزاق| هێناویانە لە ابن عباس ەوە فەرموویەتی [البَغَايَا الَّائِي يَتَزَوجَن بِغَيرِ وَلِي، أَحسَبُهُ قَالَ: لَابُدَّ مِن أَربَعَةِ: خَاطِبِ، وَوَلِي، وَشاهِدَينِ].

[البَغَايَا] ئەوانەن ئەو ئافرەتانەن کە سامان و پارە پەیدا دەکەن بە جەستەی خۆیان، واتە وەک لە کوردیدا دەوترێیت "لەش فرۆشن".

ئەفەرموون ئا ئەو لەش فرۆشانە ئەوانەن کە بەبێ وەلی زەواج دەکەن، واتە کەسێک بەبێ بوونی وەلی زەواج ئەکات بەڕاست ئەو سیفەتە سیفەتی خودی لەش فرۆشەکانە،

چونكە ئەو نیكاحە باطلە دانەمەزراوە، لەش فرۆشەكان ئەمانە ئیشیانە بەبێ وەلی زەواج ئەكەن لەگەڵ هەركەسێكدا كە بیانەوێت.

لابوود دەبێت چوار تەرەف تێیدا ئامادەبێت :

**١- خاطب : ئەو پیاوەی كە داوای ئەو ئافرەتەی كردووە .**

**٢- وەلی ئافرەتەكە .**

**٣ - دوو شاهێدیش .**

| عبد الرزاق | لە مصنف دا لە ابو هريرة وە دەفەرموویت : [لَا تُنكِحِ المَرأَةُ نَفسَهَا]

واتە : **ئافرەت نابێت خودی خۆی نەفسی خۆی نیكاح بكات لەگەڵ پیاوێكدا بەبێ ئامادەبوونی شاهیدو بەبێ ئامادەبوونی ولی ئەمر.**

[فَإِنَّ الزانِيَةَ تُنكِحُ نَفسَهَا]، **بەڕاستی ئافرەتی زیناكار خۆی نیكاحی نەفسی خۆی دەكات لەگەڵ پیاوێكدا.**

| سعيد ی كوڕی منصور | له سننه كەیدا [بە ژمارە : ٥٣٢] لە هارونی السُّلمي ئەوه ئەفەرمووێت : ئافرەتێک هات بۆلای جابری کوڕی زید پێی وت: [أَنتَ أَبُو الشَّعثَاءِ؟] ئایا تۆ باوکی شعثاء ی؟ ئەویش وتی : بەڵێ.

ئەویش وتی : ئافرەتێک [زَوَّجَت نَفسَها؟] ئافرەتێک بە نەفسی خۆی لەگەڵ پیاوێک زەواجی کردووە، واتە خۆی داوە بە شوو، بەبێ ئامادەبوون و ئاگاداربوونی شاهید و وەلی ئەمرەکەی.

فەرمووی: [تِلكَ امرَأَةٌ تُسَمِّيهَا العَرَبُ البَغِيَّ] واتە : ئەو ئافرەتە کە تۆ باسی دەکەیت واتە ئەوانەیە کە عەرەب ناویان ناوە " البَغِي " واتە لەش فرۆش.

وتی: [مَا أَفحَشَكَ يَا شَيخُ]

فَقال : ئافرەتەکە ووتی : شتەکەت زۆر ناشرینە زۆر توندە کەلامەکەت کە وتت.

ئەویش وتی: [الَّذِي جَاءَ بِالفَاحِشَةِ أَفحَشُ]

**ئەو کەسەی کە هاتووە بەفاحیشە ئەوە بەڕاستی فاحیشترە و حەقوایە و قسەی پێ بووترێ.** چونکە ئەوەی ئەو کارە دەکات خۆی نیکاحی خۆی دەکات بەبێ ئامادەبوونی وەلی و ئیزن و ئاگاداربوون وە بەبێ بوونی شاهید بەڕاستی ئەو کەسە کەسێکی فاحیشەیە.

|عبد الرزاق| لە مصنف كەی لە |الثوري| ئەفەرمووێ: پرسیاركرا لە ابن عمر عبدالله كوڕی ئیمامی عمر ـ رضی الله عنه ـ دەربارەی ئافرەتێک جاریەیەكی هەیە ئایا دەتوانێت بیدا بە شوو زەواجی بۆ ڕێک بخات؟

فەرمووی : **نەخێر** [لَا، وَلَكِن لِتَأمُرَ وَلِيَّهَا فَلیُزَوَّجها] **ئەبێت فەرمانكات بە وەلی ئەو جاریە ئەو بیدات بە شوو.**

|عبد الرزاق| لە مصنف و |ابن أبي شيبة| لە مصنف هێناویانە لە |ابن عباس| فەرموویەتی : [لَا نِكَاحَ إِلَّا بِإِذنِ وَلِي أَو سُلطَانٍ]

واتە : **نیكاح بوونی نیە بەبێ ئیزنی وەلی ئافرەتەكە یان سوڵتان نەبێت.** ئەوكاتەی كە ئافرەت هیچ وەلی ـەكی نەبوو ئەوكات سوڵتان بەو شەرت و مەرجەی موسڵمان بێت ئەبێتە وەلی ئەو ئافرەتە.

|عبد الرزاق| لە ابن طاوس وە لە باوكیەوە ئەفەرمووێت: [فَرقُ بَینَ النكَاحِ، وَالسفَاحِ الشُّهُودُ]

واتە: **جیاوازی نیكاحی شەرعی و وە نیكاحێک زواجێک كە هیچ ئەساسیات و مەرجێكی شەرعی نیە بریتیە لە بوونی شاهید.**

|عبدالرزاق| لە |الزهري| یەوە ئەفەرمووێت: [نَكَحَت بِنتُ حُسَين إِبرَاهِيمَ بن عَبدالرَّحمنِ بن عَوفٍ بِغَيرِ إذنِ وَلِيِّهَا]

**واتە : كچەكەی حسین نیكاحی كرد بەبێ ئیزنی وەلی یكەی وەلی ئەو كچە ئەو ئافرەتە هیچ ئیزنی لەسەر نەبوو، نەفسی خۆی نیكاح كرد بۆیە هیشام ی كوڕی إسماعیل نوسی بۆ عبدالملك كە [أَن فَرَق بَينَهُما] هەردووكیان جیابكاتەوە لە یەک، ئەگەر چوبێتەلای [فَلَهَا مَهرُهَا بِمَا استَحَلَّ مِنهَا] ئەوكاتە مهرەی و مارەیەكەی پێیدەداتەوە و بۆی ئەگەڕێنێتەوە.**

|سعید ی كوڕی منصور| [بەژمارە : ٥٣١] لە سننەكەیدا |عبد الرزاق| لە مصنف [بە ژمارە : ١٠٤٩٢] لە إبراهیم ـەوە فەرموویەتی : [لَيسَ لِلنسَاءِ مِنَ العَقدِ شَيءٌ قَالَ : لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِي].

**بۆ ئافرەت عەقد بوونی نیە لە هیچ شتێكدا، لە عەقدی زەواجدا ئافرەت هیچ بەشێكی نیە لە شاهێد بووندا.** واتە ناكرێ لە عەقدا ئافرەت بكەی بە شاهید، ئەو دوو شاهیدە كە بە مەرج باسكراوە بۆ زەواجێكی شەرعی ئەبێت هەردووكیان "پیاو" بن، [لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِي] **نیكاح بوونی نیە بەبێ وەلی**، بەبێ وەلی ئەمری ئافرەتەكە .

|سعیدی كوڕی منصور| لە سننە كەیدا لە حسن بصری ـەوە ئەفەرمووێت: كە پرسیارمكرد دەربارەی ئافرەتێک هیچ وەلیەكی نیە [لَيس لها وَلِيُّ، أَتُزَوَجُ نَفسَهَا؟] **ئايا ئەتوانێ مادەم ئەم ئافرەتە وەلی نیە نەفسی خۆی بدات بە شوو؟ واتە خۆی زەواجی خۆی ئەنجام بدات لەگەڵ كەسێكدا بەبێ بوونی ولی ئەم ئافرەتە؟**

فەرمووی: [لَا يُزَوَجُهَا إِلَّا الوَلِيُّ] **نابێت هیچ كەسێک بیدا بەشووزەواجی بۆڕێک بخات ئیلا وەلی یەكەی نەبێت .**

منیش وتم [إِنَهُ لَا وَلُيَّ لَهَا] ئەو وەلی نیە، وەلی نەماوە وەفاتیانكردووە ئەوانەی كە باوكە برایە مامەیە دوواتر كە فوقها باسیانكردووە كێ لەدووای كێ دەبێتە وەلی، فەرمووی مادەم وەلی نەبێت، [قَالَ : فَالسُّلطَانُ ، وَأَبَى إِلَّا ذَلِكَ] فەرمووی : **مادام وەلی نیە سوڵتان دەبێتە وەلیەكەی ، بەبێ وەلی نیكاح و زەواج بوونی نیە.**

|ابن أبي شيبة| لە مصنف [بەژمارە : ١٥٩٣٤] لە الحسن ـەنەوە فەرموویەتی: [لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِي] واتە: **نیكاح بوونی نیە بەبێ وەلی،** [وَشَاهِدَي عَدلِ] وە دوو شاهیدیش [ وَبِصَدَقَةِ مَعلُومَةِ] مارەیەكی دیاریكراو، [وَمَشهُودِ عَلانِيَةَ] وە بە شاهێدگیراوێكی ئاشكرا.

لە مسائلِ |حرب| [بە ژمارە : ٣٩٨] لە ابن المبارك ـەوە فەرموویەتی [لا نكاحَ إلا بولي، وأرى أن يفرقَ بَينَهُما]

|ابن مبارك| فەرموویەتی : **نیكاح بوونی نیە بەبێ وەلی، وەمن وای ئەبینم ئەبێت جیایان بكەنەوە مادەم بەبێ وەلی ئەو نیكاحە بەستر ابێت .**

لە مسائلِ |ابي داود| ـدا [بەژمارە: ٢٢٨] ئەفەرمووێت : گوێم لە |أحمد| بوو پرسیاری لێكرا [كَم أَدنَى مَا يَكُونُ فِي النَكاح؟] ئەوەی كە زۆر كەمە لە نیكاحدا ئەبێت بونی هەبێت چی و چین بە مەرج؟

فەرمووی: [ خَاطب/ئەو پیاوەی داوای ئەو ئافرەتە دەكات، وَالَّذي يُزَوجُ، وَالشَّاهِدَانِ / وە دوو شاهید]

سَمِعتُ أحمدَ يَقول : پاشان ئیمامی أحمد فەرموویەتی: [لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِي] **نیكاح بوونی نیە بەبێ وەلی.** [فَإِن لَم يَكُن وَلِيٌّ فَالسُلطَانُ]

**خۆ ئەگەر ئەو ئافرەتە وەلی نەبێت ئەوكاتە سوڵتان وەلی ئەمری موسڵمانان ئەبێتە وەلی ئەمری ئەو ئافرەتە .**

ئەمە بریتی بوو لەوەی کە باسمانکرد دەربارەی ئەوەی کە زەواج بوونی نـیە بەبێ "وەلی ئـەمر".

وە هەروەها سـەلەف بە مەرجیان گرتووە وەلی ئەمر بۆ ئافرەتەکە وەهەروەها "دوو شاهێد"

خۆ ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدانەبوو ئەو زەواج و عەقدە "باطله" بەهیچ جۆرێک جائیز و ڕەوانیە وە پێوویستە جیابکرێنەوە لە یەکتری، وە دەچێتە حاڵەتی " زینـاوە "، بەبێ وەلی ئەمر وە بەبێ شاهید، بەدزیەوە.

طارق الكردي

٢٠٢١-١٠-٢٨ | ١٤٤٣ - ربيع الأول -٢١

وصلى الله وسلم على حبيبنا محمد وعلى ال وأصحاب اجمعين .